


دەوڵەتی ئیسلامی

# بەڵگەکان لەسەر حوکمی دۆستایەتیکردنی موشریکان

شێخ

سلیمان کوڕی عبد الله
کوڕی محمد کوڕی عبد الوهاب

رحمهم الله

وەرگێڕانی

ئاری عبد الرحمن

# بەڵگەکان لەسەر حوکمی دۆستایەتیکردنی موشریکان

شێخ
سلیمان کوڕی عبد الله
کوڕی محمد کوڕی عبد الوهاب
(رحمهم الله)

ساڵی ١٢٣٣ کۆچی وەفاتی کردووە

وەرگێڕانی: ئاری عبد الرحمن

مكتبة الهمة

## پێشەکی وەرگێڕ

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلوات الله وسلامه عليه وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، أما بعد:

پێشەوا أبو محمد البغوي رحمه الله لە تەفسیری ئایەتی 22 ی سورەتی المجادلة فەرموویەتی: (أَخْبَرَ أَنَّ إِيمَانَ الْمُؤْمِنِينَ يَفْسُدُ بِمُوَادَّةِ الْكَافِرِينَ وَأَنَّ مَنْ كَانَ مُؤْمِنًا لَا يُوَالِي مَنْ كَفَرَ، وَإِنْ كَانَ مِنْ عَشِيرَتِهِ) ا.هـ

واتە: "الله تعالی هەواڵی داوە کە باوەڕی ئیمانداران تێکدەچێت و نامێنێت بە دۆستایەتی کردنی کافران، وە ئەو کەسەش کە ئیماندارە دۆستایەتی و موالاتی ئەو کەسانە ناکات کە کوفریان کردووە(کافرن)، ئەگەرچی لە هۆز و عەشیرەتەکەی خۆشی بێت".

هەر کەسێکیش بۆنی پەیامی ئیسلامی کردبێت و تەوحیدی ناسیبێت ئەوە دەزانێت کە یەکێك لە توندترین کۆڵەکەکانی دینی ئیسلام بریتیە لە دۆستایەتیکردنی ئیمانداران و دوژمنایەتیکردنی کافران (الولاء والبراء)، شتێکی ڕوون و ئاشکراشە کە لە ئێستادا ئەم بیروباوەڕە بە تەواوی وازی لێ هێنراوە و پێچەوانە کراوەتەوە، بیروباوەڕێك کە قورئان و فەرموودە پڕیەتی لە بەڵگە و دەق دەربارەی؛ کەچی هیچ کاریگەریەکی لە ئەرزی واقیعدا نابینرێت مەگەر بە دەگمەن نەبێت، هەڵگرانی ئەم بیروباوەڕەش بە تەواوی نامۆ بوون و لە هەموو

لایەکەوە تەنگیان پێ هەڵچنراوە (والله المستعان)، هەر بۆیە واجبە لەسەر هەموو موەحیدێك کە بەپێی توانای خۆی هەڵسێت بە بڵاوکردنەوەی ئەم بیروباوەڕە پاکە و ڕوون کردنەوەی بۆ خەڵك و تێگەیاندنیان لەم بنچینەیە و هەوڵدان بۆ گێڕانەوەیان بۆ هەڵوێستی ڕاستەقینەی دینی ئیسلام بەرامبەر بە کافر و موشریکان، بە تایبەت دوای داهێنانی چەندەها بیر و بۆچوونی ڕازاوە لە ڕووکەش و بۆگەن لە ناخ و ناوەڕۆك کە بوونەتە هۆی نەهێشتنی دۆستایەتی و دوژمنایەتی(الولاء والبراء) لە دڵی موسڵمانان و هەوڵدان بۆ ڕیشەکێش کردنی؛ وەکو "ئازادی" "پێکەوە ژیان" "مرۆڤایەتی"....هتد لەم بیروباوەڕە پیس و پۆخڵانە کە وای کردووە خەڵك دۆستایەتی کردنی کافر و بێ باوەڕان بە شتێکی ڕازاوە بزانن، لەوەش خراپتر بیدەنە پاڵ دینی ئیسلام و وایدابنێن کە شتێکی چاك دەکەن ولا حول ولا قوة إلا بالله.

لەم پەیامەشدا شێخی پایە بەرز و زانای بە کردەوە سلیمان بن عبد الله ٢١ بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر حەڕام بوونی دۆستایەتی کردنی کافران و کافربوونی هەرکەسێك کە ئەم شتە ئەنجام بدات، وە لەگەڵ هەر بەڵگەیەکدا ڕوونکردنەوەیەکی جوانی لەسەر داوە و چەسپاندوویەتی، پێمان وایە هەر کەسێك بیخوێنێتەوە ئەوە هیچ بیانوویەکی نامێنێت و حوجەجەی پەیامی بەسەردا بەرپاکراوە لەم مەسەلەیەدا، لە الله تعالى داواکارین لێی قبوڵ بکات و پاداشتی بداتەوە، هەروەها لە ئێمەشی وەربگرێت و نییەتمان تەنها بۆ خۆی پاك بکاتەوە، وە بیکاتە مایەی سود بۆ موسڵمانان و بۆ هەر کەسێکیش کە دەیخوێنێتەوە، والله المستعان وعليه التكلان.

## پێشەکی [کتێبخانەی هیممە]

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه، أما بعد:

بەڕاستی دۆستایەتی و دوژمنایەتی(**الولاء والبراء**) لە گەورەترین بنچینەکانی دین و جێگیرترین بنەماکانی ئیسلامە، تەوحیدی بەندەکانیش نایەتە دی تەنها بە دۆستایەتی لەپێناو الله و دوژمنایەتی لەپێناو الله نەبێت، هەروەها بە خۆشەویستی لەپێناو الله و ڕق لێبوونەوە لەپێناو الله، جا ئەهلی ئیسلامی خۆشدەوێت و پشتیوانی و دۆستایەتیان دەکات، هەروەها دوژمنایەتی ئەهلی شیرك(هاوەڵپەیداکەران) دەکات و ڕقی لێیان دەبێتەوە و جیهاد دەکات لە دژیان و بەڕائەتیان لێ دەکات.

بیروباوەڕێکی جێگیرە وەکو جێگیربوونی چیاکان، هیچ حوکمێك نیە لە کیتابی الله کە بەڵگەی زیاتری لەسەر بێت و ڕوونتر بێت وەك لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی(الولاء والبراء)، دوای واجب بوونی تەوحید و حەڕام بوونی پێچەوانەکەی[1]، بە هەمان شێوە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ (السيرة) پڕیەتی لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی بە گوتە و بە کردەوە، لە سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خۆی، هەروەها سوننەتی هاوەڵەکانی رضوان الله علیهم.

---

(١) سبيل النجاة والفكاك، دانراوی شێخ حمد بن عتيق النجدي رحمه الله.

بەڵام طاغوتەکانی سەردەم پێداگر بوون لەسەر جەنگان دژی الولاء والبراء بە جۆرەها ڕێگە و شێواز، بۆیە ڕەواجیان دا بە پێکەوە ژیانی ئاشتی لە نێوان مرۆڤەکان(بە موسڵمان و بە کافرەوە)هەروەها هەستان بە داهێنانی نیشتیمان پەروەری و نەتەوایەتی کە دۆستایەتی و خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ نەوەی نیشتیمان و نەتەوە پێویست دەکەن ئەگەرچی لە بێباوەڕترینی کافرەکان بێت، هەروەها بانگەوازیان کرد بۆ ڕێزگرتن لە کافرە ئەسڵییە شەڕکەرەکان بە بیانووی ئەوەی کە ئەوان ئەهلی پەیمان و سەلامەتین، هەروەها ڕێزگرتن لە مورتەدان بە بیانووی ئازادی بیروڕا و دین... لە بەرامبەر ئەمەشدا ڕووبەڕووی موەحیدان بوونەوە و گورزیان لێ وەشاندن تاکو وایان لێهات – لە کاتێکدا لە وڵاتەکانی خۆیان بوون – یان ئەوەتا کوژراون یان بەندکراون یان دەربەدەر کراون.

ئەم سیاسەتەی طاغوتەکانیش تێگەیشتنەکانی خەڵکی سەردەمی ئێمەی تێکەڵاو کردووە، لە ئەنجامدا لەناو ئێمەدا کەسی وای لێ کەوتۆتەوە کە دەدرێتە پاڵ ئیسلام(بەناو موسڵمانە) کەچی نازانێت ئەسڵ و بنچینەی دینەکەی چیە، وە "بنچینەی دین و بنەماکەی بریتین لە دوو فەرمان: یەکەم: فەرمان کردن بە پەرستنی الله بە تەنها و بەبێ هاوەڵ و شەریك، هاندانیش لەسەر ئەمە، **هەروەها دۆستایەتی کردن لەپێناویدا، هەروەها تەکفیرکردنی ئەوکەسەی کە وازی لێ دەهێنێت**، دووەم: ئاگادارکردنەوە لە شیرك و هاوەڵ پەیداکەری لە پەرستنی الله، توندی و سەختیش لەمەدا، **هەروەها دوژمنایەتی کردن تیایدا و تەکفیرکردنی ئەوکەسەی کە ئەنجامی دەدات**" [١]

---

(١) الواجبات المتحتمات المعرفة على كل مسلم ومسلمة، لأبي عبد الله محمد بن عبد الوهاب

## پێشەکی

(بەڵگەکان لەسەر حوکمی دۆستایەتی کردنی موشریکان **"الدلائل في حكم موالاة أهل الإشراك"**) هەروەها (توند و تۆڵترین وابەستەکانی باوەڕ **"أوثق عرى الإيمان"**)[1] هەردوو پەیامەکەش دانراوی شێخ سلیمان بن عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب ن [2] (رحمهم الله)، لە الله داواکارین بیانکاتە هۆی سود وەرگرتن بۆ موسڵمانان.




(١) لە وەرگێڕانەکەماندا تەنها پەیامی یەکەم وەرگێڕدراوە و دووەمیان لەگەڵدا نیە، ئەمەش بە لەبەرچاو گرتنی گرنگی و پێویستیەکەی، بەڵام من لێرەدا پێشەکیەکەم وەك خۆی نووسیوەتەوە کە برایانمان لە کتێبخانەی هیممە بۆیان نووسیوە، لە الله داواکارین کاتێکی تر بۆمان ئاسان بکات هەردووکیان بەیەکەوە بڵاو بکەینەوە.

(٢) شێخی عەللامە سلیمان کوڕی عبد الله کوڕی محمد کوڕی عبد الوهاب کوڕی سلیمان کوڕی علي التميمي النجدي یە، ساڵی ١٢٠٠ ك لەدایکبووە لە شارۆچکەی درعیە کە ئێستا دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای شاری ڕیاز لە بانی نەجد لە دوورگەی عەرەبی، لە ساڵی ١٢٣٣ ك کۆچی دوایی کردووە (رحمه الله وأسكنه فسيح جناته).

**شێخ سلیمان بن عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب رحمه الله فەرموویەتی:**

بزانە - ڕەحمەتی الله ت لێ بێت-:

مرۆڤ هەرکاتێك موافەقە[1] و پەسەند کردن بۆ موشریکان ئاشکرا بکات لەسەر دینەکەیان: لە ترسی ئەوان، یان وەك خۆنزیك کردنەوە و خۆپارێزی لێیان بۆ بەرپەرچ دانەوەی شەڕ و خراپەکەیان، ئەوا ئەو کاسە کافرە وەك ئەوان، ئەگەرچی ڕقیشی لە دینەکەیان بێت و ڕقی لەوانیش بێت، هەروەها ئیسلام و موسڵمانانیشی خۆشبوێن، ئەمە لەکاتێکدا گەر هیچ شتێکی تری نەکردبێت تەنها ئەمە نەبێت، ئەی چۆن بێت گەر هاتوو لە خاکی دەسەڵات بێت و بانگیان بکات بۆ لای خۆی، وە بچێتە ژێر گوێڕایەڵییان و پەسەندکاری و موافەقە دەربخات بۆ دینە باتڵ و پوچەڵەکەیان، هەروەها یارمەتیان بدات لەسەر ئەو شتە بە پشتگیری و ماڵ و سامان، هەروەها دۆستایەتیان بکات وە دۆستایەتی نێوان خۆی و موسڵمانان ببڕێت، لە ئەنجامدا ببێتە سەربازی شیرك و گومەز و ئەهلەکەی، دوای ئەوەی سەربازی ئیخلاص و تەوحید و ئەهلەکەی بوو؟

جا بەڕاستی هیچ موسڵمانێك گومانی لەوەدا نیە کە ئەم کەسە کافر و بێ باوەڕە، لەو کەسانەیە کە سەختترین دوژمنایەتی هەیە دژ بە الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

---

(١) ڕازی بوون.

هیچ کەسێکیش لەم حوکمە دەرناهێنرێت تەنها کەسی زۆرلێکراو نەبێت: ئەویش ئەو کەسەیە کە موشریکەکان زاڵ دەبن بەسەریدا جا پێی دەڵێن: کوفر بکە، یان ئەو شتە بکە، ئەگەرنا ئاوات لێ دەکەین و دەتکوژین، یاخود دەیگرن و ئەشکەنجەی دەدەن تاکو موافەقە و هاوشێوەیان دەکات، ئەوکات جائیزە بۆی کە بە زمان هاوشێوەیان بکات، لەگەڵ ئارام بوونی دڵی بە ئیمان(باوەڕ). بەڕاستی زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك بە گاڵتە قسەیەکی کوفریی بکات ئەوە کافر دەبێتەوە، ئەی چی دەربارەی کەسێك کە بە ئاشکرا کوفر بکات بەهۆی ترسان و حەز و تەماح بۆ دونیا ؟!

وە منیش هەندێك بەڵگە لەسەر ئەمە باس دەکەم، بە پشتیوانی و یارمەتی الله:

**بەڵگەی یەکەم:** گوتەی الله تعالى: {وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ} [البقرة : 120] واتە: هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد (ﷺ)، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەکەویت.

الله تعالى هەواڵی داوە کە جوولەکە و گاورەکان(نەصارا) و بە هەمان شێوە هاوەڵ پەیداکەران(موشریکەکان)، ڕازی نابن لە پێغەمبەر (ﷺ) تا ئەوکاتەی شوێنیان دەکەوێت و شایەتی دەدات کە ئەوان لەسەر حەقن. ئینجا فەرموویەتی: {قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ} [البقرة : 120] واتە: پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی الله (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموولایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ

ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لە لایەن الله هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەکت دەست ناکەوێت.

وە لە ئایەتێکی تر: {إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ} [البقرة : 145] واتە: بەڕاستی ئەوکات (گەر واتکرد) ئەوە تۆ لە ستەمکارانی.

جا ئەگەر هاتوو پێغەمبەر (ﷺ) هاوشێوەیان بکات لە ڕووکەشدا بەبێ ئەوەی بیروباوەڕی دڵی وابێت، بەڵام لە ترسی شەڕ و خراپەی ئەوان و بە مەبەستی خۆنزیك کردنەوە بێت لێیان ئەوا ئەوکات لە ستەمکاران دەبوو(حیسابی ئەوانی بۆ دەکرا)، ئەی چی دەربارەی کەسێك کە بۆ گۆڕپەرست و گومەز پەرستەکان وای دەربخات کە ئەوان لەسەر حەق و ڕێنمایی ڕاست و دروستن؟ چونکە ئەوان ڕازی نابن تەنها بەو شتە نەبێت.

**بەڵگەی دووەم:** گوتەی الله تعالى: {وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} [البقرة : 217]

واتە: (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێ بکەن لە دین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا هەر کەس لە ئێوە پاشگەز بێتەوە لە ئاینەکەی و بە کافریش بمرێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان

پووچەڵ دەبێت لە دنیاو قیامەتدا و ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر.

جا الله تعالى هەواڵی داوە کە کافران بە بەردەوامی دژی موسڵمانان دەجەنگن تا ئەوکاتەی لە دینەکەیان پاشگەزیان دەکەنەوە ئەگەر بۆیان بکرێت، لە هەمان کاتدا مۆڵەتی نەداوە کە موافەقە و هاوشێوەیان بکرێت لە ترسی گیان و ماڵ و حورمەت(داوێن)، بەڵکو هەواڵی داوە کە هەر کەسێك هاوشێوەیان بکات دوای ئەوەی لە دژی جەنگان بۆ ئەوەی شەڕ و خراپەکەیان بگێڕێتەوە ئەوا هەڵگەڕاوەیە(مورتەدە)، جا ئەگەر لەسەر ڕیددە و هەڵگەڕانەوەکەی بمرێت دوای ئەوەی موشریکان شەڕیان لەگەڵی کرد و دژی جەنگان؛ ئەوە لە ئەهلی ئاگرە کە تا هەتایی تیایدا دەمێنێتەوە، ئەی چۆن بێت دەربارەی کەسێك کە هاوشێوە و موافەقەیان بکات بەبێ ئەوەی دژی بجەنگن؟

جا ئەگەر کەسێك عورز و بیانووی نەبێت کە هاوشێوەیان بکات دوای ئەوەی بجەنگن لە دژی؛ ئەوە بۆت دەردەکەوێت و دەزانیت کە ئەوانەی دێن بۆ لایان و بە خێرایی دەڕۆن بەرەو موافەقە کردن و هاوشێوە کردنیان(ڕازی کردنیان) بەبێ ئەوەی ترسابن لێیان یان جەنگابن لە دژیان، ئەوانە ئەولاترن کە عوزر و بیانوویان نەبێت، وە ئەوانە کافر و مورتەدن.

**بەڵگەی سێیەم:** گوتەی الله تبارك وتعالى: {لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً} [آل عمران : 28]

واتە: نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئەوەی کاری وا بکات، ئەوکارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئیمانیی بە الله نەمێنێت، مەگەر لەبەر ئەوەی خۆتان بە بێگومان لە شەڕیان بپارێزن و قوتاربن.

جا الله تعالی قەدەغەی کردووە لە ئیمانداران کە کافران بکەنە دۆست و هاوڕێ و هاوەڵی خۆیان لەجیاتی ئیمانداران سەرەڕای ئەوەی لێشیان بترسن، هەروەها هەواڵی داوە کە هەرکەسێك ئەم شتە بکات ئەوا (فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ) واتە: نابێت بە دۆستانی الله ئەوانەی کە پەیمانی ڕزگار بوونیان پێ دراوە لە ڕۆژی دوایی، (إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً) واتە: تەنها مەگەر خۆتان لێیان بپارێزن و ڕووڵی قوتار بوون بدەن لە شەڕ و خراپەکەیان، ئەویش ئەوەیە گەر هاتوو مرۆڤ سەرکوت کراو(بێ دەسەڵات) بێت لەگەڵ ئەوان، توانای نەبێت دوژمنایەتیان بکات، ئەویش ژیان لەگەڵیان ئاشکرا دەکات بۆیان، دڵیش ئارامە بە بوغزاندن(ڕق لێ بوونەوە) و دوژمنایەتی، هەروەها چاوەڕوان کردنی نەمان و لاچوونی بەربەست، جا ئەگەر لاچوو ئەوا دەگەڕێتەوە سەر دوژمنایەتی و بوغزاندن.

ئەی چۆن بێت ئەو کەسەی کە بیانکات بە دۆست و هاوەڵی خۆی لەجیاتی ئیمانداران بەبێ هیچ عوزر و بیانوویەك، تەنها خۆشویستنی ژیانی دونیا نەبێت بەسەر دوارۆژدا، هەروەها ترسان لە موشریکان و نەترسان لە الله ؟! بەڕاستی الله تعالی ترسان لەوانی نەکردووە بە عوزر و بیانوو، بەڵکو الله تعالی

فەرموویەتی: {إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} [آل عمران : 175]

واتە: ئەوە بەڕاستی تەنها شەیتانە یاوەرەکانی خۆی دەترسێنێت، ئێوەی (ئیماندار) لێیان مەترسن، بەڵکو هەر لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن.

**بەڵگەی چوارەم:** گوتەی الله تعالی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ} [آل عمران : 149]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێ دینن، ئەوە بەرەو دوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، ئەوسا ئیتر بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە.

جا الله تعالی هەواڵی داوە: کە ئەگەر ئیمانداران گوێڕایەڵی کافران بکەن، ئەوە هەر دەبێ بەرەو دوا بیانگێڕنەوە و پاشگەزیان بکەنەوە لە ئیسلام، چونکە ئەوان قەناعەت و دڵنیاییان لەوان نایە بەبێ کوفر، وە هەواڵی داوە کە ئەوان ئەگەر ئەم شتەیان کرد؛ دەبن بە دۆڕاو و شکست خواردوو لە دونیا و دوارۆژ، مۆڵەتیشی نەداوە کە موافەقە و هاوشێوە و گوێڕایەڵییان بکرێت بەهۆی ترسان لێیان.

هەر ئەمەشە کە واقیعە و بوونی هەیە، چونکە ئەوان دڵنیا نابن لەوانەی کە هاوشێوەیان دەکەن تەنها بەوە نەبێت کە شاهێدی بدەن ئەوان لەسەر حەقن، هەروەها ئاشکرا کردنی دوژمنایەتی و بوغز و قین بەرامبەر موسڵمانان، هەروەها بڕینەوە دەست لێیان(نەهێشتنی پەیوەندی لەگەڵیان).

ئینجا فەرموویەتی: {بَلِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْۖ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ} [آل عمران : 150] واتە: (ئەی ئیمانداران) بەڵکو الله یارو یاوەرتانە، بێگومان ئەو زاتە چاکترین پشتیوان و یاریدەدەرتانە.

چونکە لە پشتیوانی و گوێڕایەڵی الله دەوڵەمەندی و تەواویەتی هەیە وەك لە گوێڕایەڵی کردنی کافران.

جا ئای حەسرەت و خەفەت بۆ ئەو بەندانەی کە تەوحیدیان ناسی و گەشەیان کرد تیایدا و ماوەیەکی زۆر دینی ئەوان بوو، چۆن دەرچوون لە ویلایەت و یاوەری الله و باشترین سەرخەر و پشتیوان، بەرەو یاوەری گومەزەکان و شوێنکەوتووانی، وە بەو یاوەریەش ڕازی بوون لەجیاتی یاوەری ئەو زاتەی کە جڵەوی هەموو شتێکی بە دەستە؟ {بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا} [الكهف : 50] بەڕاستی خراپترین گۆڕینەوەیە لەلایەن ستەمکاران کە دۆستایەتی و یاوەری الله یان گۆڕیەوە بە دۆستایەتی کردنی شەیتان و هاوەڵەکانی.

**بەڵگەی پێنجەم:** گوتەی الله تعالى: {أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُۚ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ} [آل عمران : ١٦٢]

واتە: ئایا ئەو کەسەی (بە پەرستن و چاکەکاری) شوێنی ڕەزامەندیی الله کەوتبێت، وەکو ئەو کەسە وایە (کە بەهۆی گوناهو تاوانەوە) شایستەی خەشم و قینی الله بێت؟ بێگومان شوێنی ئەو جۆرە کەسانە دۆزەخە کە سەرنجامێکی ناخۆشە.

الله تعالى هەواڵی داوە کە یەکسان نین ئەو کەسانەی شوێن ڕەزامەندی الله کەوتوون، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە شوێن ئەو شتانە کەوتوون کە الله توڕە دەکەن، هەروەها سەرەنجام و مانەوەشیان لە دۆزەخە لە ڕۆژی دوایی، گومانیش لەوەدا نیە کە پەرستنی پەروەردگاری میهرەبان بە تەنها و پشتیوانی کردنی ئەو پەرستنە هەروەها بوونی مرۆڤ لەو ڕیزەدا؛ بریتیە لە ڕەزامەندی الله، هەروەها پەرستنی گومەز و مردووەکان و پشتیوانی کردنی ئەو پەرستنە و بوونی مرۆڤ لەو ڕیزەدا؛ لەو شتانەیە کە الله توڕە دەکات؛ یەکسان نین لای الله ئەو کەسانەی کە پشتیوانی دەکەن لە تەوحید و پاڕانەوە بە تەنها لە الله و چوونە ڕیزی ئیمانداران، لەگەڵ ئەو کەسەی کە پشتیوانی شیرك و پاڕانەوە لە مردووان دەکەن و دەچنە ڕیزی موشریکان(هاوەڵ پەیداکەران).

ئەگەر گوتیان: دەترسین، پێیان دەوترێت: درۆ دەکەن، بە هەمان شێوە الله تعالى ترسانی نەکردۆتە عوزر و بیانوو بۆ ئەو کەسانەی کە شوێن ئەو شتانە دەکەون کە الله پێی توڕە دەبێت و خۆیان دوور دەخەنەوە لەو شتانەی کە پێی ڕازی دەبێت.

زۆرێکیش لە شوێنکەوتووانی ناحەق"باطل" واز لە حەق دەهێنن و بەجێی دەهێڵن لە ترسی نەمان و لەدەست چوونی دونیاکەیان، ئەگەرنا خۆ ئەوان حەق دەناسن و باوەڕیان پێی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەو شتە نابنە موسڵمان.

**بەڵگەی شەشەم:** گوتەی الله تعالى: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} [النساء: ٩٧]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد، فریشتەکان پێیان دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لەکوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز کراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی الله فراوان و پان و پۆر نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

واتە: ئێوە لەناو چ دەستە و لایەنێك بوون؟ ئایا لەناو دەستەی موسڵمانان بوون یان لەناو دەستەی موشریکان؟

جا بیانوویان هێنایەوە بەوەی کە ئەوان لەناو دەستەی موسڵمانان نەبوون بەهۆی لاواز کردنیان، بەڵام فریشتەکان بیانووەکەیان لێ قبوڵ نەکردن وپێیان فەرموون: {قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} واتە: باشە ئایا زەوی الله فراوان و پان و پۆر نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

هیچ کەسێکی عاقڵیش گومان ناکات لەوەی کە خەڵکی شارەکان ئەوانەی کە لە موسڵمانان دەرچوون، وە چوونە نێو موشریکان و دەستە و کۆمەڵەکانیان، گەورەترە لەوانەی کە وازیان لە کۆچ کردن هێناوە بە هۆی خۆبەستنەوە بە نیشتیمان و خێزان و ماڵ و ساماناکەی، ئەمەو سەرەڕای ئەوەی ئایەتەکە لەسەر خەڵکانێك لە دانیشتوانی مەککە هاتۆتە خوارەوە، موسڵمان بوون و ڕێگری کۆچ کردنیان لێ کرا، جا کاتێك موشریکان دەرچوون بەرەو جەنگی بەدر، زۆریان لێ کردن کە لەگەڵ ئەواندا دەربچن، ئەوانیش بە ترسەوە دەرچوون، موسڵمانانیش ئەوانیان کوشت لە ڕۆژی بەدر، جا کاتێك زانیان کە کوژراون خەمبار بوون و فەرموویان: براکانی خۆمان کوشت! الله تعالی ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند دەربارەیان.

ئەی چی دەربارەی خەڵکی شارەکان، ئەوانەی کە پێشتر لەسەر ئیسلام بوون، بەڵام تەوقی ئەو ئیسلامەیان لە ملی خۆیان کردەوە، ڕەزامەندی و هاوشێوە کردن و موافەقەیان بۆ ئەهلی شیرك و هاوەڵ پەیداکەران دەرخست لەسەر دینەکەیان، وە چوونە ژێر گوێڕایەڵییان و داڵدەیان دان و پشتیوانیان کردن، وە پشتیان لە ئەهلی تەوحید هەڵکرد، هەروەها ویست و ڕوغبەتیان کردە سەر ڕێگایەکی تر بێجگە لە ڕێگای ئەهلی تەوحید وە بە هەڵەیان دانان، هەروەها جنێو پێدان و تانە لێدان و عەیبدار کردنی ئەهلی تەوحید و گاڵتە پێ کردن و بە نەفامی زانینی ڕاو بۆچوونیان لە جێگیر بوونیان لەسەر تەوحید و ئارام گرتن لەسەری هەروەها لەسەر جیهاد کردن لەو پێناوە [هەموو ئەم شتانە] دەرکەوت تیایاندا، هەروەها پشتیوانیان کردن دژی ئەهلی تەوحید بە ویستی خۆیان نەك

بە زۆر لێکردن، وە بە هەڵبژاردەی خۆیان نەك بە ناچاری؟! بەڕاستی ئەمانە ئەولاترن بە کافر بوون و بە ئاگر، لەوانەی کە وازیان هێناوە لە هیجرەت و کۆچ کردن بەهۆی خۆبەستنەوە بە نیشتیمان و ترسان لە کافران وە لەگەڵ سوپای ئەوان دەرچوون بە زۆر لێکراوی و ترسانەوە.

**جا ئەگەر کەسێك وتی:** ئایا زۆرلێکردن(ئیکراه) نابێتە عوزر و بیانوو بۆ ئەوانەی کە لە ڕۆژی بەدر کوژران؟

**دەگوترێت:** نەخێر نابێتە بیانوو، چونکە ئەوان لە سەرەتای کاروبارەکەیاندا خاوەن عوزر و بیانوو نەبوون، چونکە لەگەڵ کافران مانەوە نیشتەجێ بوون، بۆیە دوای ئەوە بە زۆرلێکردن(ئیکراه) بیانوویان نابێت، چونکە ئەوان خۆیان هۆکار بوون بۆ ئەم شتە کە لەگەڵیان مانەوە و وازیان لە هیجرەت(کۆچ کردن) هێنا.

**بەڵگەی حەوتەم:** گوتەی الله تعالى: { وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ} [النساء : ١٤٠]

واتە: بەڕاستی (الله تعالى) لە قورئاندا ئەم بڕیارەی ناردووە بۆ سەرتان کە: هەر کاتێک لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفر و گاڵتە بە ئایەتەکانی الله دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان بەگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەک ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت).

الله تعالى باسی کردووە کە لە قورئاندا بەسەر ئیمانداران دایبەزاندووە کە ئەگەر گوێیان لە ئایەتەکانی الله بوو کوفری پێ دەکرێت و گاڵتەی پێ دەکرێت، ئەوان نابێ لەگەڵیان دابنشین تا ئەوکاتەی دەڕۆنە سەر باسێکی تر جگە لەمە، وە هەر کەسێك دابنیشێت لەگەڵ کافران ئەوانەی گاڵتە بە ئایەتەکانی الله دەکەن لە حاڵەتی کوفر و گاڵتە کردنەکەیان، ئەوا ئەویش وەك ئەوان وایە، جیاوازیشی نەکردووە لەنێوان کەسێك کە بترسێت و کەسانی تریش غەیری ئەو، تەنها کەسی زۆرلێکراو نەبێت.

ئەمە و لەکاتێکدا ئەوان لە یەك وڵات بوون لە سەرەتای ئیسلام، ئەی چی دەربارەی کەسێك کە لەناو فراوانی ئیسلام و سەربەرزی و وڵاتەکەی بێت، ئەویش بانگی کافران بکات بۆ وڵاتەکەی ئەوانەی کە گاڵتە بە ئایەتەکانی الله دەکەن، وە بیانکاتە هاوەڵ و هاوڕێی خۆی(لەگەڵیان دابنیشێ)، وە گوێی لە کوفر و گاڵتە کردنەکەیان بێت، وە پەسەندیان بکات لەسەر ئەم شتە، هەروەها ئەهلی تەوحید دەر بکات و دووریان بخاتەوە؟!

**بەڵگەی هەشتەم :** گوتەی الله تبارك وتعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} [المائدة : ٥١]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی

پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی اللە هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

جا اللە تعالی نەهی کردووە لە ئیمانداران کە گاور و جولەکە بکەن بە دۆست و هاوەڵی خۆیان، وە هەواڵی داوە کە هەر کەسێك لە ئیمانداران بیانکاتە دۆست و هاوەڵی خۆیان ئەوا ئەویش لەوانە، حوکمی ئەو کەسانەش بە هەمان شێوەیە کە کافران بکات بە هاوەڵ و دۆستی خۆی لە ئاگرپەرستان(المجوس) و بتپەرستەکان، ئەویش هەر لەوانە.

جا ئەگەر موجادیلێك بێت و مشتومڕ بکات لەسەر ئەوەی کە پەرستنی گومەزەکان و پاڕانەوە لە مردووەکان لەگەڵ اللە شیرك نیە، وە ئەهلەکەشی موشریك نین، ئەوا کاروبارەکەی ڕوون دەبێتەوە و مکوڕ بوون کوفرەکەی ئاشکرا دەبێت.

هەروەها اللە تعالی جیاوازی نەکردووە لەنێوان کەسی ترساو و جگە لەویش، بەڵکو اللە تعالی هەواڵی داوە کە ئەوانەی نەخۆشی و بێ باوەڕی هەیە ئەو شتە دەکەن لە ترسی ئەوەی کە سەختی کارەساتەکان توشی بین، لە ئەنجامدا ئەوەی کە لە دڵیاندایە لاچوو لە باوەڕ هێنان بە وەعد و پەیمانی ڕاستەقینەی اللە بە سەرخستنی ئەهلی تەوحید، لە ئەنجامدا پێشڕەویان کرد و بە خێرایی ڕۆیشتن بەرەو شیرك و هاوەڵ پەیداکەری، لە ترسی ئەوەی سەختی و ناخۆشییان توش ببێت، اللە تعالی فەرموویەتی: {فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ

يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ ۚ فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا أَسَرُّوا فِي أَنفُسِهِمْ نَادِمِينَ} [المائدة : ٥٢].

واتە: بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و (ئیمان لاوازن) بەپەلە دەچن بۆ لایان (بە زمانی حاڵ) دەڵێن: دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت، جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە الله سەرکەوتن ببەخشێت (بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەک لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێببەخشێت) ئەوکاتە باوەڕلاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە.

**بەڵگەی نۆیەم:** گوتەی الله تعالی: {تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ} [المائدة : ٨٠]

واتە: زۆربەیان دەبینیت ڕازین بە خۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، سوێند بە الله دەست پێشخەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە پەروەردگاریان لە خۆیان تووڕە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە.

جا الله تعالی باسی کردووە کە دۆستایەتی کافران تووڕەیی الله و مانەوەی تا هەتایی لە ئاگر لەگەڵ خۆی دەهێنێت تەنها بە ئەنجامدانی، ئەگەرچی مرۆڤ ترسیشی هەبێت، تەنها کەسی زۆرلێکراو(المکرە) نەبێت بە شەرت و مەرجی

خۆی[١] ، ئەی چۆن بێت گەر هاتوو لەگەڵ ئەمەدا کوفری ئاشکراش کۆببێتەوە لەگەڵی، کە بریتیە لە: دوژمنایەتی کردنی تەوحید و ئەهلەکەی، هەروەها هاوکاری کردن لەسەر نەمانی پاڕانەوە لە الله بە تەنها، هەروەها لەسەر جێگیر کردنی پاڕانەوە لە غەیری ئەو؟!

**بەڵگەی دەیەم:** گوتەی الله تعالى: {وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ} [المائدة : ٨١]

واتە: خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بە الله و بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانەیان نەدەکرد بەخۆشەویست و سەرپەرشتیاری خۆیان، پشتیان بەوان نەدەبەست، بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یاخین و (حەق و ڕاستی مەبەستیان نیە، بەڵکو بەردەوام دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن).

جا الله تعالى باسی کردووە کە دۆستایەتی کافران پێچەوانەی ئیمان و باوەڕ هێنانە بە الله و پێغەمبەر و ئەوەش کە بۆی دابەزیوە، ئینجا هەواڵی داوە کە هۆکاری ئەمە ئەوەیە کە زۆرێك لەوانە فاسق و لادەر بوون، وە جیاوازیشی نەکردووە لە نێوان ئەو کەسەی کە لە سەختی و کارەساتەکان دەترسێت و ئەو کەسەش کە ناترسێت.

---

(١) مەبەستی ئەوەیە: تەنها ئەو ئیکراهـ(زۆرلێکردن)ە نەبێت کە شەرت و مەرجەکانی دێنە جێ، لەوانەش: کەسی ئەنجامدەر بتوانێت ئەو شتە ئەنجام بدات کە هەڕەشەی پێ دەکات، کەسی فەرمان پێکراویش دەستەوسان بێت لە دوورخستنەوە و بەرگری کردن، وە بەسەر گومانیدا زاڵ ببێت ئەگەر هاتوو خۆی قەدەغە بکات لە ئەنجامدانی ئەو شتە ئەوا ئەو هەڕەشەیەی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، وە ئەو شتەش کە هەڕەشەی پێ کردووە شتێکی یەکسەرپی و فەوری بێت... جگە لەمەش لە مەرجەکانی ئیکراهـ کە لە کتێبەکانی زانایان بە درێژی باسکراوە.

ئەمەشە حاڵی زۆرینەی ئەو مورتەدانە(هەڵگەڕاوانە) بەر لەوەی مورتەد ببنەوە، زۆرێك لەوان فاسق و لادەر بوون، ئەمەش ڕایکێشان بەرەو دۆستایەتی کافران و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام[1]، پەنا بە الله دەگرین لەمە.

**بەڵگەی یانزەهەم:** گوتەی الله تعالى: {وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ} [الأنعام: ١٢١]

واتە: دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و (بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن، ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریک و هاوەڵگەرن.

ئەم ئایەتەش دابەزی کاتێك موشریکان گوتیان: "ئەوەی کە بە خۆتان کوشتووتانە دەیخۆن، کەچی ئەوەش ناخۆن کە الله کوشتوویەتی!" جا الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند[2].

---

(١) مەبەستی بەشێکی خەڵکی ناوچەی (نەجد)ە کە مورتەد بوونەوە بەهۆی دۆستایەتی کردن و مولاتیان بۆ سوپا داگیرکەرە تورکییەکان، جا ئەوان لە بنچینەدا فاسق و خراپەکار بوون، ئەو خراپەکاریەش بەرەو ئەوەی بردن کە پێشوازی لە مورتەدە تورکییەکان بکەن و ڕێکەوتنیان لەگەڵ بکەت و پشتیوانیان بکەن بۆ ئەوەی لە شەڕ و خراپەکەیان پارێزراو بن، بۆیەش ئەو خەڵکە بەم شتە کوفریان کرد(کافر بوونەوە).

(٢) جامع البيان في تفسير القرآن، کە ناودارە بە (تفسير الطبري)، نووسراوی ئەبی جەعفەر محمد کوڕی جرير الطبري.

جا ئەگەر کەسێك ببێتە موشریك بە گوێڕایەڵی کردنی موشریکان، بەبێ ئەوەی جیاوازی بکات لەنێوان کەسی ترساو و غەیری ئەویش، تەنها کەسی زۆرلێکراو نەبێت، ئەی چۆن بێت دەربارەی کەسێك کە گوێڕایەڵیان بکات لە حەڵاڵکردنی دۆستایەتی کردنیان، هەروەها چوونە ڕیزی ئەوان، هەروەها پشتیوانی کردنیان، هەروەها شایەتی دان لەسەر ئەوەی کە ئەوان لەسەر حەقن، هەروەها حەڵاڵکردنی خوێنی موسڵمانان و موڵك و سامانیان، هەروەها دەرچوون لە کۆمەڵی موسڵمانان بەرەو کۆمەڵی هاوەڵ پەیداکەر و موشریکان؟! جا ئەوان ئەولاترن بە کوفر و شیرك لەوانەی کە پەسەندی و گوێڕایەڵیان کردوون لەسەر ئەوەی کە گۆشتی مردارەوە بوو حەڵاڵ بێت.

**بەڵگەی دوانزەهەم:** گوتەی الله تعالی: {وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ} [الأعراف: ١٧٥] واتە: ئەی محمد(ﷺ) هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێبەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە.

ئەم ئایەتەش دەربارەی پیاوێکی کە زانا بووە و پەرستش و عیبادەتی الله ی زۆر دەکرد، لە سەردەمی بەنی ئیسرائیل، پێی دوترا (بِلعَام) هەروەها ناوی هەرە بەرز و بڵندی الله (الاسم الأعظم) ی دەزانی[١]

(١) ناوی هەرە گەورەی الله(اسم الله الأعظم)، لە ژمارەیەك فەرموودەی صەحیحدا هاتووە، لەوانەش فەرموودەی ئەنەس ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو دوعایەکی دەکرد، فەرمووی: (داوای لە الله تعالی کرد بە ناوە گەورەکەی، ئەو ناوەی کە ئەگەر داوای لێ بکرێت پێی وەڵامی دوعاکە دەداتەوە و گەر پاڕانەوەی پێ بکرێت وەڵامی دەداتەوە) [الترمذي و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە].

ابن أبي طلحة لە ابن عباس ـەوە دەیگێڕێتەوە (ﭭ) فەرموویەتی: "کاتێك موسا دابەزی بۆ سەریان – واتە بۆ سەر ستەمکاران – ئامۆزاکان و گەلەکەی هاتن بۆ لای، گوتیان: موسا پیاوێکی توند و بەهێزە، سەربازی زۆریشی لەگەڵدایە، ئەگەر هاتوو زاڵ ببێت بەسەرماندا ئەوە لەناومان دەبات، بۆیە داوا لە الله بکە کە موسا و ئەوانەش کە لەگەڵیدان دووریان بخاتەوە، گوتی: ئەگەر هاتوو داوا لە الله بکەم، ئەوە دونیا و دواڕۆژیشم دەڕوات، ئەوانیش هەر بەردەوام بوون لەگەڵی تا ئەوکاتەی کە دوعای لێیان کرد، بۆیەش الله دەریهێنا لەوەی کە لەناویدا بوو، ئەمەش گوتەی الله تعالی ـیە: {فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ}[١]

هەروەها ابن زيد فەرموویەتی: "هەواو ئارەزووی خۆی لەگەڵ گەلەکە بوو، واتە ئەوانەی جەنگان دژی موسا (عليه السلام) و گەلەکەی"[٢].

جا الله تعالی کاروباری ئەو کەسەی باس کردووە کە لە بەڵگە و ئایەتەکانی دەرچووە، دوای ئەوەی کە الله تعالی پێی بەخشین، هەروەها زانا بوو پێیانەوە لە ئەهلی ئایەت و شوێنکەوتووانی بوو، دواتر لێی دەرچوو، واتە: وازی هێنا لە کردەوە کردن پێیان، لە دەرچوونەکەشدا باسی کردووە کە ئەو مانایە دەگرێتەوە: ئەوەیە کە پشتیوانی کردنی موشریکان و یارمەتیدانیانە بە ڕاو بۆچوونی خۆی.

---

(١) تفسير القرآن العظيم، کە ناسراوە بە (تفسير ابن كثير) دانراوی: أبي الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير الدمشقي.

(٢) تفسير الطبري.

هەروەها دوعا كردن لە موسا (علیه السلام) و ئەوانەش كە لەگەڵیدا بوون كە الله دووریان بخاتەوە لە گەلەكەی، ئەمەش بەهۆی ترسانی لە حاڵی گەلەكەی و سۆزداری و میهرەبانی پێیان، سەرەڕای ئەوەی حەق دەزانێت و بە قەتعی(بڕانەوە) باسی دەكات و قسەی پێ دەكات و شایەتی پێ دەدات، بەڵام شوێنكەوتنی گەل و هۆز و ئارەزووی خۆی هەڵیگێڕایەوە لەوەی كردەوە بەو حەقە بكات، هەروەها خۆچەسپاندنی بە زەویەوە، ئەمەش بریتی بوو لە دەرچوون لە ئایەت و بەڵگەكانی الله.

هەر ئەمەش واقیع و ڕاستەقینەی ئەو مورتەد و هەڵگەڕاوانەیە، بەڵكو گەورەتریش، چونكە الله تعالى ئەو ئایەتانەی پێ بەخشین كە فەرمان كردنی تێدایە بە تەوحید و پاڕانەوە لێی بە تەنها و بەبێ هاوەڵ و شەریك.

هەروەها نەهی كردن لە شیرك و هاوەڵ پەیدا كردن بۆی و پاڕانەوە لە غەیری خۆی، هەروەها فەرمان كردن بە دۆستایەتی ئیمانداران و خۆشویستنیان و سەرخستنیان، هەروەها دەستگرتنی هەموویان بە فەرمانی الله(حبل الله)، هەروەها چوونە ڕیزی ئیمانداران، وە فەرمان كردن بە دوژمنایەتی موشریكان و بوغزاندنیان و جیهاد لە دژیان و جیابوونەوە لێیان، هەروەها فەرمان كردن بە ڕووخاندنی بت و گومەزەكان، هەروەها لابردن و ڕووخاندنی شوێنەكانی بەدڕەوشتی و نێربازی و خراپە و مونكەڕات، ئەوانیش ئایەتەكانیان زانی و پەسەندیان كرد، ئینجا لە هەموو ئەمە دەرچوون، جا ئەوان ئەولاترن بە دەرچوون لە ئایەتەكانی الله و كوفر و ڕیددە(هەڵگەڕانەوە) وەك لە بلعام،یاخود وەكو ئەو وان.

**بەڵگەی سیانزەهەم:** {وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ} [هود: ١١٣]

واتە: نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لە الله یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت، کەسیش جگە لە الله پشتیوانتان نابێت، لەوەو دوایش یارمەتی نادرێن.

جا الله تعالی باسی کردووە کە پاڵدانەوە و مەیل دانەوە بەلای ستەمکار و کافران و کۆمەڵی زاڵمان هۆکارە بۆ چوونە ناو ئاگر، جیاوازیشی نەکردووە لەنێوان ئەو کەسانەی کە لێیان دەترسن و هەروەها جگە لەوانیش، تەنها کەسی زۆرلێکراو(مکره) نەبێت، ئەی چۆن بێت حاڵی ئەو کەسانەی کە پاڵدانەوە و مەیل بوون بەلایاندا دەکەن بە دین و ڕایەکی چاك و پەسەند، هەروەها یارمەتیان بدات بەپێی توانا بە ماڵ و بە ڕاو بۆچوون، هەروەها حەز بکات بە لەناوچوونی تەوحید و ئەهلەکەی، هەروەها زاڵ بوون و دەست بەسەردا گرتنی ئەهلی شیرك و هاوەڵ پەیداکەری بەسەریان؟ کە بەڕاستی ئەمە لە گەورەترین کوفر و مەیل چوونە بەلایاندا.

**بەڵگەی چواردەهەم:** {مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (107) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ} [النحل: ١٠٦-١٠٧]

واتە: هەرکەسێك کوفر بکات بە الله دوای باوەڕهێنانی، جگە لەوانەی کە ناچار دەکرێن وشەی کوفر بێت بەسەر زاریاندا لە کاتێکدا دڵیان پڕە لە ئیمان، بەڵام ئەو کەسەی دڵی بە کوفرو بێ دینی خۆش کردبێت، ئەوانە خەشم و قینی پەروەردگاریان لەسەرەو سزای گەورەو سەخت و دژواریان بۆ هەیە.

ئەو خەشم و قینەش لەبەر ئەوەیە چونکە بەڕاستی ئەوانە ژیانی دنیایان خۆش ویستووە تا ژیانی دوارِۆژ، بێگومان الله هیدایەتی قەوم و کافر و بێ باوەڕ نادات.

الله تعالی حوکمێکی داوە کە ئەو حوکمە ناگۆڕێت: ئەوەیە کە هەرکەسێك لە دینەکەی بگەڕێتەوە بۆ کوفر ئەوە کافرە، جیاوازی نیە ئایا عوزر و بیانووی هەبێت، لە ترسی گیان یان ماڵ یان خێزان، یاخود نا، وە جیاوازیشی نیە ئایا بە ناخ کوفر بکات یان بە ڕووکەش، یاخود بە ناخ بەبێ ڕووکەش، وە جیاوازی نیە ئایا بە کردەوە کوفر بکات یان بە گوتە، یاخود بە یەکێکیان لەمانە بەبێ ئەوی دیکەیان، وە جیاوازی نیە ئایا حەز و تەماحی بۆ دونیا بێت کە لە موشریکانەوە بە دەستی بهێنێت یاخود نا، ئەو کەسە کافرە لە هەموو حاڵێکدا، تەنها کەسی زۆرلێکراو(المکره) نەبێت، کە بە زمانی ئێمەش بریتیە لە: زەوت کراو(المغصوب).

جا ئەگەر مرۆڤێك لەسەر کوفر زۆری لێکرا(ناچار کرا)، یان پێی بگوترێت: کوفر بکە گەرنا دەتکوژین، یان لێت دەدەین، یان موشریکان بیگرن و لێی بدەن، ئەویش نەتوانێت دەربازی ببێت تەنها بە موافەقە و هاوشێوە کردن(پەسەند کردن) یان نەبێت، ئەوە بۆی هەیە لە ڕووکەش هاوشێوەیان بکات، بە مەرجێك

دڵی ئارام بێت بە ئیمان و باوەڕ، واتە جێگیر بێت لەسەری و باوەڕی پێ هەبێت، بەڵام ئەگەر بە دڵ هاوشێوەیان بکات ئەوە کافرە ئەگەرچی زۆرلێکراویش بێت.

ڕووکەشی گوتەکانی ئەحمەد یش: ئەوەیە کە لە وێنەی یەکەمدایە، بە زۆرلێکراو حیساب ناکرێت تا ئەو کاتەی موشریکەکان ئازار و ئەشکەنجەی دەدەن، چونکە کاتێك یەحیای کوڕی معین چوو بۆ لای لە کاتێکدا نەخۆش بوو، سەلامی لێ کرد و ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە، ئەویش هەر بەردەوام بوو عوزر و بیانووی دەهێنایەوە و دەیفەرموو: گوتەی عەممار ! هەروەها الله فەرموویەتی: { إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ}، ئەحمەدیش ڕووی خۆی وەرگێڕا بۆ لایەکەی تر، یەحیا فەرمووی: "عوزر و بیانوو قبوڵ ناکات"، کاتێك یەحیا دەرچوو، ئەحمەد فەرمووی: "بەڵگە بە فەرموودەی عەممار دەهێنێتەوە، فەرموودەی عەممارِیش: (مررت بهم وهم يسبونك، فنهيتهم فضربوني) واتە: "بە لایاندا تێپەڕیم لەکاتێکدا جنێویان بە تۆ دەدا، منیش نەهیم لێ کردن بۆیە لێیان دام" ئێوەش پێتان گوتراوە: دەمانەوێ لێتان بدەین"

یەحیا فەرمووی: "سوێند بە الله لە ژێر ئاسمان کەسم نەبینیوە تێگەیشتوو تر بێت لە دینی الله وەك لە تۆ"[١].

(١) ئەم بەسەرهاتە لە (طبقات الحنابلة) هاتووە کە دانراوی أبي الحسين محمد بن أبي يعلى البغدادي الحنبلي یە، وە تیایدا هاتووە کە ئیمام ئەحمەد سوێندی خوارد کە تاکو بە دیداری الله دەگاتەوە قسە لەگەڵ هیچ کەسێك نەکات لەوانەی کە وەڵامی بانگەوازەکەی مەئمونیان داوەتەوە کە گوایە قورئان مەخلوقە(دروستکراوە)، وە بیدعەی (دروستکراویەتی قورئان(خلق القرآن)) بیدعەی موعتەزیلەکانە، هەروەها گوتنی (قورئان دروستکراوە(مەخلوقە)) کوفرە، چونکە قورئان کەلام و گوتەی الله یە و سیفەتێکە لە سیفەتەکانی، وە دابەزێنراوە =

ئینجا الله تعالی هەواڵی داوە کە ئەو مورتەد و هەڵگەڕاوانە کە سینە و دڵی خۆیان بە کوفر خۆش و فراوان کردووە،ئەگەرچی بە قەتعیش باوەڕیان بە حەق هەبێت و بڵێن: ئەوەمان نەکردووە تەنها بەهۆی ترسەوە نەبێت؛ ئەوانە خەشم و تورەیی الله لەسەریانە و سزایەکی گەورە و سامناك چاوەڕێیانە.

ئینجا الله تعالی هەواڵی داوە کە هۆکاری ئەم کوفر و سزایە بەهۆی باوەڕ بوون نەبووە بە شیرك یان نەزانین و جەهل بە تەوحید یان ڕق بوونەوە لە دین یان خۆشویستنی کوفر، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوە بووە کە لەو شتەدا بەشێك لە بەشەکانی دونیای دەست دەکەوێت، لە ئەنجامدا هەڵیبژارد بەسەر ڕۆژی دوایی و ڕەزامەندی پەروەردگاری جیهانیان، فەرموویەتی: {ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ}، جا الله تعالی تەکفیری کردوون(بە کافر ناوی بردوون)، وە هەواڵی داوە کە هیدایەت و ڕێنموییان نادات، سەرەڕای ئەوەی عوزر و بیانووشیان دەهێنایەوە بە خۆشەویستی دونیا.

---

وە الله تعالی بە حەقیقەت و ڕاستەقینەیی قسەی پێ کردووە، هەروەها بە وەحی(نیگا) ناردوویەتی بۆ پەیامبەرەکەی محمد(ﷺ).. ئیمام یەحیای کوڕی معين يش لەوانەیە کە لە فیتنەی خەلقی قورئاندا تاقیکرایەوە، ئەویش گوتی قورئان مەخلوقە بە زۆرلێکراوی کە وتەی الله تعالی ى تەئویل کردبوو: (إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان)، بەڵام ئیمام ابن حنبل عوزر و بیانووی بۆ نەهێنایەوە و هەجری کرد(خۆی لێ دوور خستەوە)، چونکە ئەو پێی وابوو ئەو زۆرلێکردنەی کە بەسەر پێشەوا ابن معين هات جگە لە هەڕەشە بەبێ ئەشکەنجە هیچی تر نەبوو، کە ئەمەش حەڵاڵی ناکات بۆ موسڵمان کە هاوشێوەی کافران بکات لەو شتەی کە داوای لێ دەکەن، وە ئەو شتانەش کە خراپەی هەیە بۆ دینەکەی، ئەم تێگەیشتنە ڕاست و دروستەی ئیمام ئەحمەدیش لەلایەن ئیمام یەحیا شاهێدی ڕاست بوونی بۆ دراوە [هەروەها بڕوانە : البداية والنهاية دانراوی أبي الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير الدمشقي].

ئینجا هەواڵی داوە کە ئەو مورتەدانە لەپێناو خۆشویستنی دونیا بەسەر دوارۆژدا، ئەوانەن کە الله تعالی مۆری داوە لەسەر دڵ و گوێ و بینین(چاوەکان)یان، وە ئەوانەن کە غافڵ و بێئاگان.

ئینجا هەواڵێکی داوە هەواڵێکی دڵنیایی و ڕاستەقینەیی کە لە دوارۆژدا ئەوان دۆڕاو و خەسارەتمەندن.

**بەڵگەی پانزەهەم:** گوتەی الله تبارك وتعالى دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوتەکە: {إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا} [الكهف :٢٠ ]. واتە: چونکە بەڕاستی ئەو بت پەرستانە ئەگەر پێتان بزانن، ئەوە بەرد بارانتان دەکەن، یان دەتانگێڕنەوە بۆ ناو ئایینی خۆیان، ئەو کاتە ئیتر هەرگیز سەرفراز نابن.

جا الله تعالی لە هاوەڵانی ئەشکەوتەکە باسی کردووە کە ئەوان لە موشریکانەوە باسیان کردووە کە ئەوان ئەگەر زاڵ بوون بەسەرتاندا و ئێوەیان گرت ئەوا لەنێوان دوو شت دان: یان ئەوەتا بەرد بارانتان دەکەن، واتە: بە خراپترین شێوە دەتانکوژن بە بەرد باران کردن، یان ئەوەتا دەتانگێڕنەوە بۆ دین و ئاینی خۆیان، (وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا) واتە: وە ئەگەر هاوەشێوە و موافەقەیان بکەن لەسەر دینەکەیان دوای ئەوەی زاڵ دەبن بەسەرتاندا و دەتانگرن، ئەوە هەرگیز سەرفراز نابن.

جا ئەمە حاڵی کەسێکە کە هاوشێوەیان بکات دوای ئەوەی کە زاڵ دەبن بەسەریدا، ئەی چۆن بێت دەربارەی کەسێك کە لە دوورەوە هاوشێوەیان بکات و نامەیان بۆ بنێرێت، هەروەها وەڵامی داواکاریەکانیان بداتەوە بەبێ ئەوەی زاڵ بووبن بەسەریدا و بەبێ ئەوەی زۆری لێکرابێت، وە لەگەڵ ئەوەشدا وا حیساب دەکەن کە ئەوان لەسەر ڕێگە و ڕێبازی ڕاستن و ڕێنموویی کراون ؟!

**بەڵگەی شانزەهەم:** گوتەی الله تعالی: { وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ۖ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ ۖ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ} [الحج : ١١]

واتە: هەندێك لە خەڵکی هەیە تەنها لە یەك حاڵەتدا پەرستش دەکات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە دنیا بە دڵی ئەو بێت)، ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەك هات، سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە، ئا بەو حاڵەتەی دنیا و قیامەت لە دەست خۆی دەدات و زەرەرمەندی هەردوو لایە و هەر ئەوەشە خەسارەتمەند و زەرەرمەندی ڕوون و ئاشکرا.

جا الله تعالی هەواڵی داوە کە هەندێك خەڵك هەن بەندایەتی الله دەکەن لەسەر حەرف، واتە: لەسەر لایەنێك، ئەگەر هاتوو خێری هاتە ڕێ واتە: سەرکەوتن و سەربەرزی و تەندروستی و فراوانی و ئاسایش و سەلامەتی و هاوشێوەی ئەم شتانە، دڵی پێ خۆش دەبێت واتە: جێگیر دەبێت وە دەڵێت: ئەمە دینێکی چاکە، جگە لە خێر و چاکە هیچی دیکەمان تیایدا نەدیوە!

وە ئەگەر فیتنەیەکی توش بوو واتە: ترس و نەخۆشی و هەژاری و هاوشێوەی ئەم شتانە، بەسەر ڕووی خۆیدا هەڵدەگەڕێتەوە، واتە: هەڵدەگەڕێتەوە و مورتەد دەبێتەوە لە دینەکەی، وە دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەهلی شیرك و هاوەڵ پەیداکەری!

جا ئەم ئایەتە هاوتایە لەگەڵ حاڵی هەڵگەڕاوەکان لە دینی خۆیان لەم فیتنەیە[1]، هاوشێوە بە هاوشێوە، چونکە ئەوان پێش ئەم فیتنەیە بەندایەتی الله یان دەکرد لەسەر حەرف، واتە: لەسەر لایەنێك(لایەنی خۆشی)، لەو کەسانە نەبوون کە بەندایەتی الله دەکەن لەسەر یەقین(دڵنیایی) و خۆڕاگری، جا کاتێك ئەم فیتنەیەیان توش بوو لە دینەکەیان هەڵگەڕانەوە، وە موافەقە و هاوشێوە کردنیان نیشاندا بۆ موشریکان، هەروەها ملکەچ بوون و گوێڕایەڵیان پێ بەخشین، وە لە کۆمەڵی موسڵمانان دەرچوون بەرەو کۆمەڵی موشریکان، جا ئەوان لەگەڵیاندا دەبن لە دوارۆژ(قیامەت) هەروەك چۆن لە دونیاش لەگەڵیاندان، لە ئەنجامدا دونیا و قیامەتیشیان دۆڕاند، بەڕاستی ئەمەیە شکست و دۆڕانی ڕوون و ئاشکرا.

ئەمە و سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لەوانیش لەناو سەلامەتی و تەندروستی دابوون، هیچ دوژمنێکیان بۆ نەهاتبوو، بەڵکو ئەوان گومانیان بە الله خراپ بوو،

---

(١) ئەوانیش مورتەدەکانی نەجد بوون کە فیتنەی داگیرکەری تورکی ڕووی ڕاستەقینەی ئاشکرا کردن هەروەك لە پێشتر باس کرا.

وا گومانیان برد کە ناحەق و باطل سەردەکەوێ(یدیل)[1] بەسەر حەق و ئەهلەکەی، لە ئەنجامدا گومان بردنی خراپیان بە الله لەناوی بردن، هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: {وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ} [فصلت : ٢٣] واتە: ئا ئەوەبوو گومانی ناپەسەندتان کە بووتان بەرامبەر پەروەردگارتان؛ ئێستا بوو بەهۆی داخزان وتیاچوونتان و بەوهۆیەوە چوونە ڕیزی زەرەرمەندانەوە.

جا تۆ ئەی ئەو کەسەی کە الله تعالی نیعمەتی جێگیر بوون لەسەر ئیسلامی پێ بەخشیوی، ئاگادار بە لەوەی کە شتێك لە گومان بچێتە دڵتەوە یاخود ئەو مۆڕتەدانە بە باش سەیر بکەیت، وە گوایە موافەقە و هاوشێوە کردنیان ڕایەکی باشە، لە ترسی گیان و ماڵ و پیرۆزیەکان، چونکە ئەم گومانە بوو کە زۆرێك یەکەمەکان و دواهەمەکانی خستۆتە نێو شیرك و هاوەڵ پەیداکەری بۆ الله الله تعالی ش عوزر و بیانووی پێ نەداون بەمە. ئەگەرنا زۆرێك لەوان حەق دەناسن و بە دڵەکانیان باوەڕیان پێیەتی، بەڵام لە ڕاستیدا بە شیرك و هاوەڵگەری دین و بەندایەتی بۆ الله دەکەن، بەو هەشت بیانووەی کە الله تعالی لە کیتابەکەیدا باسی کردوون یان بە هەندێکیان، بەڵام عوزر و بیانووی بە کەس نەداوە نە بەو بیانووانە و نە بە هەندێکیشیان، فەرموویەتی: {قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا

(١) أدال يديل إدالة: وهي الغلبة والنصر، يُقَالُ: أُدِيل لَنَا عَلَى أعدائنا أي نُصِرْنا عَلَيْهِمْ، وَكَانَتِ الدَّوْلة لَنَا، والدَّوْلة: الاِنْتِقَالُ مِنْ حَالِ الشدَّة إِلى الرَّخاء؛ وَمِنْهُ حَدِيثُ أَبي سُفْيان وهِرَقْلَ: نُدالُ عَلَيْهِ ويُدالُ عَلَيْنَا أَي نَغْلِبه مَرَّةً ويَغلبنا أُخرى[لسان العرب]

وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ} [التوبة : ٢٤]

واتە: ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: ئەگەر باوو باپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانیەک دەترسن کە شکان و بێ بازاڕی ڕووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز دەکەن لێتان تێک نەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستترو نازدارتر بێت لە الله و پێغەمبەرەکەی و جیهادو تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا الله تعالی دێت بە فەرمانەکانیەوە و (تۆڵەتان لێ دەسێنێت)، الله تعالی ش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنوور دەرچوو نادات.

**بەڵگەی حەڤدەهەم:** گوتەی الله تعالی: {إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ** ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ** فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ** ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ} [محمد : ٢٥-٢٨]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی پاشگەز بوونەوەو بەرەو دوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوانە شەیتان بەفێڵ و تەڵەکە تەماداری کرد بوون، بەهیوای تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانیش فریوی دەبوون ** ئەو زاڵ بوونی شەیتانە بەهۆی ئەوەوەبوو کەبەڕاستی دووڕووەکان دەیانوت

بەوانەی کەداخ لەدڵ بوون بەرامبەر ئەوەی الله دایبەزاندووە کە قورئانە: ئێمە لەمەودوا لەهەندێک هەڵوێستدا بەقسەتان دەکەین، الله ـش خۆی چاک ئاگادارە لەو نهێنی و پیلانانەی کەدەیشارنەوە ** ئاخۆ حاڵیان چۆن بێت کەفریشتەکان لەکاتی گیان کێشانیاندا بەدەم و چاوو بەرەو پشتیاندا دەماڵن ** ئەو سوکایەتی سەرەمەرگە بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی الله دەبزوێنێت، ئەوانە بێزار بوون لە ڕەزامەندی الله، خوایش کاروکردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد.

جا الله تعالی باسی ئەوانەی کردووە کە هەڵگەڕانەوە لە دینەکەیان و بەرەو دوا گەڕانەوە، کە ئەوان دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و هیدایەت و ڕێنموویی ڕوون بوویەوە بۆیان ئەجا هەڵگەڕانەوە بە عیلم و زانستەوە. بۆیەش عیلم و زانستیان بە حەق سودی پێ نەگەیاندن لەگەڵ ڕیددە و هەڵگەڕانەوە، شەیتانیش لەخۆبایی کردن بە جوانکردنی ئەو شتە و ڕازاندنەوەی ئەو ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیەی کە ئەنجامیان داوە.

حاڵی مورتەد و هەڵگەڕاوەکانیش لەم فیتنەیە هاوشێوەیە، شەیتان لەخۆبایی کردن و وا خەیاڵی بۆ کردن کە ئەو ترسەی تیایدان دەبێتە عوزر و بیانوو بۆیان لەم ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیە، وە ئەوان بەهۆی زانینی حەق و خۆشویستنی و شاهێدی پێ دانی ئەو شتانە زیانیان پێ ناگەیەنێت کە ئەنجامیان داوە، لەبیریشیان چوو کە لەناو موشریکاندا خەڵك هەن حەق دەناسن و خۆشیاندەوێت و شاهێدی پێ دەدەن، بەڵام واز لە شوێنکەوتن و کردەوە پێ

کردنی دەهێنن بەهۆی خۆشەویستی دونیا، وە لە ترسی گیان و ماڵ و خواردن و پلەو پایەکان.

ئینجا الله تعالى فەرموویەتی: {ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ}، جا الله تعالى هەواڵی داوە کە ئەو ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیەی توشیان بووە و ڕازاندنەوە و جوانکردنی شەیتان و خەیاڵ بۆ کردنیان هۆکارەکەی ئەوە گوتەیە بووە کە بەوانەیان وتووە ئەوانەی ڕقیان لەوەیە کە الله تعالى دایبەزاندووە: (سنطيعكم في بعض الأمر) واتە: لە هەندێ لە کاروبارەکاندا گوێڕایەڵیتان دەکەین.

جا ئەگەر کەسێك کافر بێت کە پەیمان بە موشریکان بدات ئەوانەی ڕقیان لەوەیە کە الله دایبەزاندووە بەوەی کە لە هەندێ کاروبار گوێڕایەڵیان بکات، ئەگەرچی ئەو شتەس ئەنجام نەدات کە پەیمانی پێ داوە، ئەی چۆن بێت کەسێك ئەگەر موافەقە و هاوشێوەی موشریکان بکات ئەوانەی کە ڕقیان لەو پەیامەیە کە الله دایبەزاندووە لە فەرمان کردن بە پەرستنی بە تەنها و بەبێ هاوەڵ و وازهێنان لە پەرستن و عیبادەتی غەیری خۆی لە هاوبەش(شەریك) و طاغوتەکان و مردووەکان، هەروەها وا نیشانی بدات کە ئەوان لەسەر ڕێگەی ڕاستن، وە ئەهلی تەوحید هەڵەیان کردووە لە شەڕ کردن لە دژیان، وە ڕاستی و حەق بریتیە لە ئاشتەوایی لەگەڵیان و چوونە نێو دینە باتڵ و پوچەڵەکەیان ؟! جا ئەوانە ئەولاترن بە ڕیددە و هەڵگەڕانەوە لەوانەی کە پەیمانیان بە موشریکان داوە کە گوێڕایەڵیان بکەن لە هەندێ کاروباردا.

ئینجا الله تعالی هەواڵی داوە دەربارەی حاڵە ترسناك و سامناکەکەیان لەکاتی مەرگ، ئینجا فەرموویەتی: (ذلك) واتە: ئەو شتە ترسناك و مەترسیدارەی لەکاتی مەرگ، {ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ}.

واتە: ئەو سووکایەتی سەرەمەرگە بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی الله دەبزوێنێت، ئەوانە بێزار بوون لە ڕەزامەندی الله، خوایش کاروکردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد.

موسڵمانیش گومانی نیە لەوەی کە شوێنکەوتنی موشریکان و چوونە ڕیزیان، هەروەها شایەتی دان بەوەی کە ئەوان لەسەر حەقن، هەروەها یارمەتیدانیان لەسەر نەمانی تەوحید و ئەهلەکەی، هەروەها پشتیوانی کردنی گومەز و شوێنەکانی بەدڕەوشتی و نێربازی: بریتیە لە شوێنکەوتنی ئەو شتانەی کە الله توڕە دەکەن و ڕق بوونەوەیە لە ڕەزامەندیەکەی، ئەگەرچی لافی ئەوەش لێ بدەن کە ئەمە بەهۆی ترسەوەیە، چونکە الله تعالی عوزر و بیانووی لە ئەهلی ڕیددە و هەڵگەڕانەوە قبوڵ نەکردووە بە ترسانیان لە موشریکان، بەڵکو نەهی کردووە لەوەی لێیان بترسن.

جا ئەمە لە کوێ و قسەی ئەو کەسە لە کوێ کە دەڵێت: هیچ شتێك لەلایەن ئێمەوە ڕووینەداوە و ئێمە لەسەر دینەکەی خۆمانین ؟!

**بەڵگەی هەژدەیەم:** گوتەی الله تعالی: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ} [الحشر : ١١]

واتە: ئایا سەرنجت نەداوە لەوانەی كە دووڕوو بوون و بەبرا بێباوەڕەكانیان لە خاوەن كتێب دەڵێن: ئەگەر ئێوە دەربكرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بەقسەی كەس ناكەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بكرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەكەین، بەمەرجێک؛ الله خۆی شایەتە كە ئەوانە بێگومان درۆزنن.

جا الله تعالی برایەتی بڕیار داوە و بەستوویەتیەوە لەنێوان دوو ڕووەكان و كافران، هەروەها هەواڵی داوە كە ئەوان لە نهێنیدا پێیان دەڵێن: (ئەگەر ئێوە دەرچوون ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین) واتە: ئەگەر محمد ﷺ زاڵ بوو بەسەرتانا و ئێوەی دەركرد لە وڵاتەكەتان ئەوە ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین (وە گوێڕایەڵی كەسیش ناكەین لە دژی ئێوە) واتە: دەربارەی ئێوە گوێ لە هیچ كەسێك ناگرین و گوێڕایەڵی بۆ كەس ناكەین لە دژی ئێوە، (وە ئەگەر جەنگتان لە دژ بكرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەكەین) واتە: ئەگەر محمد ﷺ دژتان بجەنگێت ئەوە پشتیوانیتان دەكەین و لەگەڵتان دەبین، ئینجا الله تعالی شایەتی داوە كە (ئەوان درۆزنن) لەم گوتەیەدا.

جا ئەگەر پەیمان دان بە موشریكان لە نهێنیدا كە بچن لەگەڵیان، هەروەها پشتیوانی كردنیان و دەرچوون لەگەڵیان ئەگەر دەر كران بریتی بێت لە دوو ڕوویی(نیفاق) و كوفر ئەگەرچی درۆش بكات لەو شتە، ئەی چۆن بێ كەسێك كە ئەم شتە بە ئاشكرا دەربخات و ڕاستگۆش بێت تیایدا، وە بەرەو ڕوویان بڕوات و بچێتە نێو گوێڕایەڵی كردنیان و بانگەوازیشی بۆ بكات وە پشتیوانیان بكات و

شوێنیان بکەوێت و بچێتە ڕیزی ئەوان، هەروەها یارمەتیشیان بدات بە ماڵ و سامان وە بە ڕاو بۆچوون؟!

ئەمە و سەرەڕای ئەوەی کە دوو ڕووەکان ئەم شتەیان نەکردووە تەنها لە ترسی توش بوون نەبێت بە سەختی و کارەساتەکان، هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: {فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ} [المائدة : ٥٢] واتە: بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و (ئیمان لاوازن) بەپەلە دەچن بۆ لایان (بە زمانی حاڵ) دەڵێن: دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت..

جا حاڵی زۆرێکیش لەو مورتەدانە هەمان شێوەیە لەم فیتنەیەدا، چونکە عوزر و بیانووی زۆرێك لەوان ئەمە بوو، ئەو بیانووەیە کە الله تعالى باسی کردووە دەربارەی ئەو کەسانەی نەخۆشی لە دڵیاندا هەیە، الله تعالى ش ئەم بیانووەی لێ قبوڵ نەکردوون، فەرموویەتی ﷻ : {فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا أَسَرُّوا فِي أَنفُسِهِمْ نَادِمِينَ ** وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُوا خَاسِرِينَ} [المائدة : ٥٢-٥٣] واتە: جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە الله تعالى سەرکەوتن ببەخشێت (بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەك لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێببەخشێت) ئەوکاتە باوەڕلاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە ** ئەوسا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (لەناو خۆیاندا بەسەرسامیەوە) دەڵێن: ئایا ئەو دووڕووانە ئەوانەن کە سوێندیان بە الله

دەخوارد و جەختیان لەسەر دەکرد کە گوایە بەڕاستی لەگەڵتانداین؟! کەچی کارەکانیان پووچەڵ بوەوەو خەسارەتمەند و زەرەرمەند و مایە پووچ بوون.

ئینجا الله تعالی فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ} [المائدة : ٥٤] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کەس لە ئێوە لە ئاین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەکات) ئەوە لە ئایندەدا الله کەسانێک دەهێنێتە کایەوە (ئەوەندە ڕێک و پێک و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت، هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵندو نەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا.

جا الله تعالی هەواڵی داوە کە هەر دەبێت لەگەڵ بوونی موڕتەد و هەڵگەڕاوەکان، خۆشەویست و موجاهیدان(تێکۆشەران)یش هەبن، هەروەها وەسفی کردوون بە ملکەچی و خۆبەکەمزانی بەرامبەر ئیمانداران، هەروەها سەربەرزی و توند و تیژی و دڵڕەقی بەرامبەر کافران، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە خۆبەکەمزانی و ملکەچی و نەرم و نیانی بۆ گومەز پەرستەکان و ئەهلی بەدڕەوشتی و نێربازییە، هەروەها سەربەرزی و توڕەیی و توند و تیژیەکەی بەرامبەر ئەهلی تەوحید و ئیخلاص(نییەتپاکی)یە، بۆیە ئەمە بەسە کە ببێتە بەڵگە لەسەر کافر بوونی ئەو کەسەی کە موافەقە و هاوشێوەیان بکات، ئەگەرچی لافی ئەوەش لێ بدات کە ترساوە، چونکە بەڕاستی الله تعالی فەرموویەتی: {وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ }، واتە: گوێ نادەن بەو کەسەی کە لۆمەیان دەکات و

ئازاریان دەدات لەسەر دینەکەیان، بەڵکو بەردەوام دەبن لەسەر دینەکەیان و لەسەری دەڕۆن و جیهاد و تێکۆشانی تێدا دەکەن، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە بەلای لۆمەی یەکێك لە دروستکراوان، وە نە بەلای تورەیی و نە بەلای ڕازی بوونەکەی، بەڵکو هەوڵدان و ئامانجی داواکراویان ڕازی بوونی گەورە و پەرستراوەکەیانە، هەروەها ڕاکردن لە تورەییەکەی؛ ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە هەوڵ و ئامانجە داواکراوەکەی بریتی بێت لە: ڕازی بوونی بەندەکانی گومەز و ئەهلی بەدڕەوشتی و نێربازیی، هەروەها داوا کردنیان و ڕاکردن لەو شتەی کە تورەیان دەکات، کە ئەمەش ئەوپەڕی گومڕایی و نەمانی پشت و پەنایە.

ئینجا الله تعالی دەفەرموویت: {ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} [المائدة : ٥٤] واتە: ئەمەش فەزڵ و بەخششی الله یە، دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە بیەوێت، وە الله ﷻ فراوانگیر و زانایە.

جا الله تعالی هەواڵی داوە کە: ئەم خێر و بێرە گەورەیە، وە ئەم سیفەتە چاك و سوپاسكراوانە، بۆ ئەهلی ئیمان و باوەڕ ئەوانەی کە جێگیرن لەسەر دینەکەیان لە کاتی ڕوودانی فیتنە، ئەمە بە هەوڵ و توانای خۆیان نیە، بەڵکو ئەمە فەزڵ و بەخششی الله یە، دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە بیەوێت، هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: {يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ} [البقرة : ١٠٥]

واتە: ئەو پەروەردگارە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی تایبەت دەکات بۆ هەر کەسێک بیەوێت و (شایستە بێت) وە الله خاوەنی ڕێزو بەخشش و فەزڵی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە.

ئینجا الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ} [المائدة : ٥٥]

واتە: بەڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر الله و پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن باوەڕیان هێناوە، کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە.

الله تعالى هەواڵێکی داوە بە مانای ئەمر و فەرمان، بە دۆستایەتی کردنی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران، هەر نەهی کردن لەخۆ دەگرێت لە دۆستایەتی کردنی دوژمنانی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران، ئەوەش شاراوە نیە کە ئایا کام حیزب و دەستە نزیکترە لە الله و پێغەمبەرەکەی هەروەها بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدان: ئایا ئەهلی گومەز و بەدڕەوشتی و نێربازی و مەشڕوب(مەی) و خراپەکان، یان ئەهلی ئیخلاص(نییەتپاکی) و بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدان؟!

جا ئەو کەسەی دۆستایەتی پێچەوانەکانیان دەکات ئەوە ویلایەت و دۆستایەتی لە جێگەیەکی تر داناوە جگە لە جێگەی خۆی، ویلایەت و دۆستایەتی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران و نوێژکەر و زەکاتدەرانی گۆڕیوە بە ویلایەت و دۆستایەتی ئەهلی شیرك(هاوەڵ پەیداکەری) و بت و گومەز پەرستەکان.

ئینجا الله تعالى هەواڵی داوە کە سەرکەوتن بۆ حیزب و دەستەکەی خۆی و ئەوانەشە کە دۆستایەتیان دەکەن، فەرموویەتی: {وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ} [المائدة : ٥٦]

واتە: جا ئەوەی کە الله و پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە پشتیوان و خۆشەویستی خۆی قەبوڵ بکات، ئەوە با دڵنیا بێت کە هەر کۆمەڵ و دەستەو تاقمی الله، زاڵ و سەرکەوتوون.

**بەڵگەی نۆزدەهەم:** گوتەی الله تعالى : {لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ} [المجادلة : ٢٢]

واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە الله و بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن.

الله تعالى هەواڵی داوە کە تۆ کەسێك نادۆزیتەوە باوەڕی بە الله و بە ڕۆژی دوایی هەبێت لە هەمان کاتدا کەسێکی خۆشبوێت کە دوژمنایەتی الله و پێغەمبەرەکەی بکات، ئەگەرچی نزیکترین کەسیش بێت لێیەوە، وە ئەمەش پێچەوانەی ئیمانە و دژیەتی، ئەم شتە و ئیمان بە یەکەوە کۆنابنەوە تەنها وەکو کۆبوونەوەی ئاو و ئاگر نەبێت.

الله تعالى لە جێگەیەکی تر فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} [التوبة : ٢٣]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، باو و باپیران و براکانتان مەکەنە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕیان خۆش ویست و هەڵیانبژارد بەسەر ئیمان و باوەڕدا، هەرکەس لە ئێوە پشت بەوان ببەستێت و خۆشی بوێن، ئائەوانە هەر ستەمکارن.

جا لەم دوو ئایەتەدا ڕوونکردنەوەی ئاشکرا هەیە کە عوزر و بیانوو بۆ هیچ کەسێك نیە لە موافەقە و هاوشێوە کردن لەسەر کوفر بەهۆی ترسان لە ماڵ و سامان و باوان و نەوەکان(منداڵەکان) و برا و هاوسەرەکان و هۆز و عەشیرەتەکان و هاوشێوەی ئەمانەش کە زۆرێك لە خەڵکی عوزر و بیانوویان پێ دەهێننەوە.

جا ئەگەر مۆڵەت و ڕوخسەت نەدرابێت بە هیچ کەسێك لە دۆستایەتی کردنیان و کردنیان بە خۆشەویستی خۆیان لە ترسی ئەوان یان لەپێناو ڕازی بوونیان، ئەی چۆن بێت کەسێك کە کافرە دوورەکان بکات بە دۆست و خۆشەویستی خۆی، هەروەها ڕازی بوون و موافەقە دەربخات بۆیان لەسەر دینەکەیان، لە ترسی هەندێك لەم شتانە و خۆشویستنیان؟!

ئەوەی جێی سەر سوڕمانیشە ئەوەیە کە ئەو شتانە بە چاك دەزانن، وە حەڵاڵی دەکەن، جا لەگەڵ ڕیددە و هەڵگەڕانەوە حەڵاڵکردنی حەڕامیشیان کۆ کردەوە.

**بەڵگەی بیستەهەم:** گوتەی الله تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ} واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بەگیانی، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن، تاکو گوتەکەی: {وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ} واتە: جا هەر کەس لە ئێوە کاری وابکات ئەوە بەڕاستی ڕێبازی ڕاستی ون کردووە، واتە: لە ڕێگەی ڕاست لایداوە.

جا الله تعالى هەواڵی داوە کە هەرکەسێك دوژمنانی الله بکات بە دۆست و هاوەڵی خۆی، ئەگەرچی هاوڕێ و نزیکیش بن، ئەوە ڕێگەی ڕاستی ون کردووە، واتە: لە ڕێگەی ڕاست لایداوە، وە لێی دەرچووە بەرەو گومڕایی، جا ئەمە لە کوێ و قسەی ئەو کەسە لە کوێ کە لافی ئەوە لێ دەدات گوایە لەسەر ڕێگەی ڕاستە، وە لێی دەرنەچووە؟! بەڕاستی ئەمە بە درۆ دانانی الله گوتەی الله یە، هەرکەسێکیش گوتەی الله بە درۆ بزانێت ئەوە کافرە، هەروەها بە حەڵاڵ زانینی ئەو شتەیە کە الله حەڕامی کردووە لە دۆستایەتی کردنی کافران، هەرکەسێکیش حەڕامێك بە حەڵاڵ بزانێت ئەوە کافرە.

ئینجا الله تعالى گومانی ئەو کەسانەی باس کردووە کە عوزر و بیانوو بە ڕەحم(خزمایەتی) و نەوە و ڕۆڵەکان دێننەوە، فەرموویەتی: { لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ ۚ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ} [الممتحنة : ٣]

واتە: خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەکتان جیادەکاتەوە، بەڕاستی الله بینایە بەو کارو کردەوەی کە دەیکەن.

جا الله تعالى عوزر و بیانووی وەرنەگرتووە لەو کەسەی کە بیانوو بە خزمەکان و ڕۆڵەکانی خۆی دێنێتەوە هەروەها ترسان(لە توش بوونیان بە ناخۆشی) و سەختی و ناڕەحەتی جیا بوونەوە لێیان، بەڵکو هەواڵی داوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا سود ناگەیەنن و هیچ قازانجێك ناگەیەنن بۆ گێڕانەوەی سزا و عەزابی الله، هەروەك الله تعالى لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: {فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ} [المؤمنون : ١٠]

واتە: جا کاتێك فوو دەکرێت بە -صور-دا ئەوە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی لەو ڕۆژەدا نی یەو کەس لە کەس ناپرسێتەوە.

**بەڵگەی بیست و یەکەم:** لە سوننەت(فەرموودە)دا ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو داود و جگە لەویش ڕیوایەتیان کردووە لە سومرەی کوڕی جوندوب رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ جَامَعَ الْمُشْرِكَ وَسَكَنَ مَعَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ)) واتە: هەرکەس کۆببێتەوە لەگەڵ موشریکێك(هاوەڵ پەیداکەرێك) و نیشتەجێ ببێت لەگەڵیدا ئەوە وەکو ئەو وایە موشریکە وایە.

جا پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا وای داناوە کە هەرکەسێك کۆببێتەوە لەگەڵ موشریکان، واتە: تێکەڵاویان ببێت و کۆببێتەوە لەگەڵیاندا و نیشتەجێ ببێت لەگەڵیان، ئەوا وەکو ئەوانە، ئەی چۆن بێت دەربارەی کەسێك کە موافەقە و هاوشێوە کردن ئاشکرا بکات بۆیان لەسەر دینەکەیان، وە داڵدەیان بدات و پشتیوانیان بکات؟!

ئەگەر گوتیان: دەترسین! پێیان دەگوترێت: درۆتان کرد، هەروەها ترسان نابێتە عوزر و بیانوو، هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ} [العنكبوت : ١٠]

واتە: هەندێك لە خەڵکی هەن کە دەڵێن: باوەڕمان بە الله هێناوە، جا کاتێك یەکێك لەوانە لە بەر الله و لە پێناوی الله تووشی ئازار و ناخۆشی کرا، وادەزانێت سزاو ئەشکەنجەی خەڵکی وەك سزای الله وایە.

جا الله تبارك وتعالى بیانووی نەداوە بە کەسێك کە لە دینەکەی پاشگەز دەبێتەوە لە کاتی ئازار و ترسان، ئەی چۆن بێت کەسێك کە هیچ ئازار و ترسێك توشی نەهاتووە، بەڵکو بەرەو باطل(ناحەق) ڕۆیشت بە خۆشەویستی بۆی وە ترسان لە سەختی و کارەساتەکان؟!

بەڵگەکانیش لەسەر ئەمە زۆرن، ئەمەش بەسە بۆ کەسێك کە الله تعالى بیەوێت هیدایەتی بدات، بەڵام کەسێك کە الله تعالى بیەوێت توشی فیتنەی بکات و گومڕای بکات، ئەوە هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ** وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ} [يونس : ٩٦-٩٧]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە وەک فیرعەون و دارو دەستەی ستەمکارو تاوانبارو گوناهکارن، بڕیاردادەی پەروەردگارت لەسەریان چەسپا، ئەوانە: باوەڕ ناهێنن ** ئەگەر چی هەرچی بەڵگەو موعجیزە هەیە بۆیان پێش بێت، ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن هەتا سزای بەئێش و ئازار دەبینن.

لە پەروەدگاری خاوەن منەت و شکۆمەند داواکارین کە بە موسڵمانی بمانژێێنێت، وە بە موسڵمانیش بمانمرێنێت، وە بمانگەیەنێت بە پیاوچاکان، بێ ئەوەی سەر شۆڕ بین و توشی فیتنە بووبین، بە ڕەحمەتی خۆی، کە ئەویش بەڕاستی بە ڕەحمترینی ڕەحمکار و میهرەبانەکانە.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

***

## قسەکانی شێخ سلیمان تەواو بوون رحمه الله(١)

---

(١) لێرەدا هەندێك ڕاستی هەیە کە پێویستە باسی بکرێت، کە زۆر کەمن ئەو کەسانەی درکییان بەم ڕاستییانە کردووە و پێی ئاگادارن، ئەویش ئەوەیە کە ئەو حاڵەی ئێستا لە جیهاندا و بە تایبەت لەناو ئوممەتی ئیسلامدا بوونی هەیە، هەرگیز مێژوو بەخۆیەوە نەیبینیوە لە بەکرێگیراوی بۆ جوولەکە و گاور و موشریکەکان هەروەها نەمانی حوکمی شەریعەت لەناوماندا و دەسەڵاتدار بوونی کۆمەڵە طاغوتێك بەسەر وڵاتەکانماندا، لە ئەنجامدا ئوممەت کەوتۆتە نێو جۆرەها کوفر و هەڵگەڕانەوە و گومڕایی و سەرلێشێواوی، وە لێمان شاراوە نیە کە چۆن دۆستایەتی ئاشکرایان هەیە لەگەڵ وڵاتانی کوفر وە چۆن خەڵکیشیان توشی جۆرەها کوفر و گومڕایی کردووە بە چەك هەڵگرتنیان بۆ طاغوتان و یارمەتی وەرگرتن لێیان و پشت بەستن پێیان و حوکم کردن بە بەرنامە و یاساکانیان، کە بەڕاستی ئەو سەردەمەی شێخ سلیمان باسی کردووە ناگاتە نیوەی ئەو حاڵەی کە لەم سەردەمەدا هەیە، جا ئایا سەردەمی ئەو خەڵك حاڵیان ئاوا بووبێت گەر ئێستا زیندوو بوایە چی دەگوت!، کە ئەمەش بابەتێکە بە ئاشکرا دیارە لێمانەوە و حاڵی تەواوی طاغوت و سەرباز و چەك هەڵگرەکانیان و ئەوانەشە کە لەگەڵیاندان بە ڕاو بۆچوون.. پەنا بە الله دەگرین. [وەرگێڕ]

